تویشووی باوەڕ
وما ينطق عن الهوى إن هو إلا وحي يوحى
محمد عبدی
بەرگی یەکەم

## پێشەکی :ـ

بێ گومان لەوەتی مرۆڤ لە سەر ئەم هەسارە (زەوی) جێ نشین کراوە بەر بەرەکانی دروست بووە بۆ دیاری کردنی ڕاستی و ناڕاستی،چونکە ئەو لایەنەی یەکێك بە ڕاستی ئەزانێت لەوانەیە یەکێکی تر بە ڕاستی نەزانێت ٠

(هەندێك گەیشتوون بە ڕاستی‌یەکانی ژیان بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر و هەندێکی تر نەگەیشتوون « لە ڕاستی‌دا هەڵەن » بەڵام بە ڕاستی ئەزانن ٠

هەندێکی تر ئەو ڕاستی‌یانەی هەن بە ڕێژەیی (سبیی) دایدەنێن ، بەڵام لە ڕاستی‌دا ڕێژەیی هەندێك لایەن نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە هەموو ڕاستی‌یەکانی ژیان ڕێژەیی بن ، چونکە ژمارەیەکی زۆر ڕاستی هەن کە تەرازووی زۆر هەستیاری خۆیان هەیە و ئەتوانرێت پێی بکێشرێت) ٠

لە ئەنجامی ئەم مشت و مڕە دوور و درێژەدا چەند ڕێبازێك پەیدا بووە و هەر کەسێك پەیڕەوی ڕێبازێك دەکات بەپێی بیر و باوەڕی خۆی ٠

لە دێر زەمانەوە و تا ئێستا بواری زانستی و ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان سەنگی مەحەك بوون بۆ دیاری کردنی چەند

ڕاستی‌یەك (بەتایبەتی لایەنی مادی) ، جا ئەگەر بێت و لە ڕووی زانستی‌یەوە لەم گەردوونە بکۆڵینەوە ئەوا ناچار دەبین دان بە بوونی خوایەکدا بنێین ، کە ئەم بوونەوەرەی دروست کردوە ٠

ئەمە لە لایەك وە لە لایەکی ترەوە ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە ئەوا بۆمان دەر دەکەوێت کە هەر وولاتێك و هەر نەتەوەیەك ڕێبازی ئیسلامی تیا بڵاو بووبێتەوە ئەوا ئەو وولاتە یا ئەو نەتەوەیە لە هەموو ناتەواویەکانی ژیان (بەتایبەتی کۆمەڵایەتی) دور بووە ٠

ئەمەش ڕاستی‌یەکە ئەوانەش باوەڕیان بە ڕێبازی ئیسلام نی‌یە دان بەم ڕاستی‌یەدا دەنێن ٠

بەڵام ئایا ڕێبازی ئیسلام وەکو هەندێك وای تێ دەڕوانن وەك ڕێبازەکانی تر زادەی بیری چەند کەسێکە یان نا ؟ ئەگەر ئێمە بەراوردێك لە نێوان ڕێبازی ئیسلام و ڕێبازەکانی تردا بکەین دەبینین جیاوازی‌یەکی زۆریان لە نێواندا هەیە کە دیاری ترینیان ئەوەیە کە ڕێبازی ئیسلام هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە و باسی کردوە پێشکەوتنی زانست و فەلسەفیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر پشت گیری بریارەکانی دەکات ،بەپێچەوانەی ڕێبازەکانی ترەوە کە هەر یەکەیان لە یەك لایەنی ژیان دەدوێ و

جگە لەوەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بڕیارە تایبەتی‌یەکانیان پوچەڵ دەبێتەوە ٠

لە کاتێکا کە ئەگەر بە وردی و بێ لایەنیەوە لە کات و شوێنی بڵاو بوو نەوەی ئاینی ئیسلام بکۆڵینەوە دەگەینە ئەو ڕاستی‌یەی کە هیچ کەسێك لەو سەردەمەدا (بەڵکو ئیستاش) نەیتوانیوە ڕژێمێکی دابڕێژێت ، بەتایبەتی لە ناو کۆمەڵگای عەرەبی ئەو سەردەمە و لەو ناوچەیەدا ٠

لە بەر ئەوە وەك زانست و ڕاستی ملی پێ کەچ کردوین کە دان پنێین بە بوونی خوایەك ڕاستی‌یەکانی ژیانیش دەستمان دەگرێت بەرەو ڕاستی ئاینی ئیسلام ٠

جا بۆ زیاتر دلنیا بوون لە گەورەیی ئاینی ئیسلام و سەلماندنی ئەم پەیامە لە لایەن خوای گەورەوە ، کاك «محمد» (خوا پاداشتی بداتەوە) هەستا بە دارشتنی چەند تابلۆیەك (کە ئەم بەرگەی لە بەر دەستی بەرێزت دایە تابۆیەکە لە تابلۆکانی) لە سەر تیشکی قورئانی بەنرخ کە سەرەڕای ئەو هەموو ڕاستی‌یەی لە قورئاندایە تەنانەت هەموو سورەت و ئایەت و ووشە و پیتەکانیشی بە پێی یاسایەکی زۆر ورد داڕێژراوە ، جگە لەوەی کە مەبەستی تەواوی خۆشی تیا دەر

بڕدراوه بۆ ئەوەی لە لایەنی ووشەکاری و جوانکاری و ڕەوانبێژی وەهیچ (تەنانەت پیتێکیش) ناتەواوی تیا دروست بێت.
هیوا دارین بە چاوێکی بۆ لایەنەوە سەیری هەموو ڕێبازێك بکرێت و ئەگەر ڕاستیش بینرا چاوی لێ نەنوقێنرێت « وە خوای گەورە پاداشتی کاك «محمد» بداتەوە (إنشأ الله)

و اخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

١٩٨٦/١٢/١٦
« ب »

# ڕوون کردنەوەیەك

پێش ئەوەی بچینە ناو تابلۆکەوە پێویستە بزانین ژمارە(١٩) چی‌یە؟ و چ سوڕێکی پێ سپێردراوە؟.

نۆزدە (١٩) ئەو ژمارەیەیە کە سەرجەمی ژمارەی پیتی ئایەتە پیتەکانی قورئانی گرتۆتە خۆو بووە بە پەرژینێك بۆ قورئانی پیرۆز – بۆ ئەو (٢٩) سورەتەی کە ئایەتە پیتیان تیا هاتووە بە تایبەتی و قورئان بە گشتی چونکە تەنها پیتێك وون بێت یا زیاد بێت لەو پیتانەی لە ئایەتە پیتەکاندا هەیە لە سورەتەکانیاندا، ئەوا بناغە و بنچینەی کش گیری ژمارەیی کە لە سەر ژمارە(١٩) بەندە هەرەس دێنێت و پەیوەندیان لێك ئەترازێت چونکە سەرجەمی پیتی ئایەتە پیتەکانی قورئان لە سورەتەکانیاندا بێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێ

هەروەها سەرجەمی پیتی هەر ئایەتەپیتێك بگریت (لەو «١٤» ئایەتە پیتەی کە لە «٢٩» سورەتی قورئاندا هاتوون) سەرجەمیان بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت

بۆ نموونە :–

(ن ★ والقلم وما یسطرون) سەرجەمی پیتی(ن) لەو سورەتانەی ئایەتە پیتەکەیان (ن)ی تیایە بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت

(الم ★ ذلك الكتاب لا ريب فيه) سەرجەمی پیتی (ئەلیف،لام،میم) لەو سورەتانەی ئایەتە پیتەکەیان (الم)ی تیایە،بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت •

هەروەها بۆ ئایەتە پیتەکانی تریش بە هەمان دەستور سەرجەمیان دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت بێ مانەوەی هیچ کەرتێك •

تەنانەت ژمارە (١٩) خۆی پەیوەست ئەکات لە گەل ژمارەی پیتی ئایەتە پیتەکات کە ژمارەیان (١٤) ئایەتە پیتە ، ئەوەتا ژمارەی پیتی ئایەتە پیتەکان ئەکاتە (٣٨) (الم ، الر ، المر ، المص ، طسم ، طس ، کهیعص ، حمعسق ، طه ، یس ، حم ، ص ، ق ، ن)ە کە ئەم ژمارەیەتی بێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت •

(٣٨ ÷ ١٩ = ٢)

ژمارە (١٩) پەیوەندی خۆی تەنها لە گەل ئایەتە پیتەکان و ژمارەی پیتی ئایەتە پیتەکاندا ـ نانوێنێت ، بەلکو پەیوەندی خۆی زۆر پتەو تر لە جیهانی ئایەتە پیتەکان ئاشکرا ئەکات لە قورئانی پیرۆزدا ، هەر وەك لە تابلۆیانی (٣٢ـ٣٣ـ٣٤ـ٣٥ـ ••••• هتد. کتێبی «نزیکترین دەرمانخانە»ی مامۆستا «بکر غریب فرج» روون و ئاشکرایە •

هەروەها ئەگەر بێت و ئێمــە سەیری ژمــارەی سورەتەکانی قورئان بکەین ئەبینین ژمارەیان (١١٤) سورەتە ، ئەم ژمارەیە بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت •

(١١٤ ÷ ١٩ = ٦)

هەروەها لە قورئاندا (بسم الله الرحمن الرحيم)(١١٤) جار هاتووە ، هەر چــەندە لــە سورەتی (التوبة)دا (بسم الله الرحمن نەهاتووە ،بەڵام ڕێژەکەی لــە سورەتی (النمل)دا پڕ کراوەتــەوە ، ئــەویش بــەوەی دووجار ناوی (بسم الله الرحمن الرحيم)ی تیــا هاتووە •

کەواتە ژمارەی (بسم الله الرحمن الرحيم) لــە قورئاندا بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت •

(١١٤ ÷ ١٩ = ٦)

لە گەڵ ئەوەشدا ژمارەی پیتەکانی (بسم الله الرحمن الرحيم) یەکسانە بە (١٩) پیت ، ئەمەش نهێنییەکی گەورەیە سەبارەت بە ئاشکرا کردنی پەیوەندی ژمارە (١٩) بە قورئانی پیروزەوە (هەر چەندە خوای بە بەزەیی باسی ژمــارە «١٩» ئــەکات لــە سورەتی «المدثر»دا دەری ئەخات کە ژمارە «١٩» کوشندەترین کودەتایە بۆ سەر تیۆری بێ باوەڕان و مایەی شانازی موسڵمانانە) •

هەروەها یەکــەم سورەت کە هاتە خوارەوە سورەتی «علق» بوو ، ئــەم سورەتە (علق) ژمارەی ئایــەتە (١٩) ئایەتە ! ، وە

(١٩)هەمین سورەتی قورئانە لە ژمارەی سورەتەکاندا

ئەم کارە هەروا گۆترە نییە بەڵکو ئاشکراترین ئاماژەیە خوای گەورە نیشانمان ئەدات بە ژمارە (١٩) و پەیوەندی بە قورئانەوە کەواتە ژمارە (١٩) ئەو پەرژینە بێ«کەلەبەر»ەیە کە قورئانی پیرۆزی لە چوار چێوەی خۆیدا شەتەك داوە

وە بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژمارە (١٩) و خولی بێ سپێر دراوی ، سەیری کتێبی «نزیکترین دەرمانخانە»ی «بکر غریب فرج، و کتێبی «قورئانو عەقلی ئەلکترۆنی»ی «صابر کرد عازبانی» بکە، ئەوسا مەزنی و بێ گەردی قورئانی پیرۆزت بۆ ئاشکرا ئەبێت.

ـ عەبدی ـ

تێبینی :ـ

تابلۆ دەر کراوەکانی قورئانی پیرۆز کە بەشێوەی کش کێری ژمارەیی دەر کراوە ، لە قورئانە چاپ کراوەکەی ئەزهەری پیرۆز (**مصحف الازهر الشریف**) چاپی **دووەم** ـ سالی (**١٩٧٨**) زاینی «سەبارەت بە تابلۆکەی ئەم کتێبە» دەزهێزاوە ، کە مامۆستا «**د. محمد رشاد خلیفة**» یەکێکە لەوانەی سەر پەرشتی کردوە هەر لە شێوە و چۆنیەتی نووسینی نژوەکەی و دانانی ووشە و پیت و .... هتد . چونکە ئەم قورئانەی ئەزهەر لە سەر شێوە دەست نووسەکەی خۆی (واتە چۆن لە ژێر چاودێری و ئامازە کردنی پێغەمبەر « صلى الله عليه وسلم » خەلیفەی سێیەم « عثمان بن عفان » نووسیویەتیەوە) لە چاپ دراوە !.

وە خوێنەری بەڕێز بۆ چەسپاندنی دیمەنەکانی ئەم تابلۆیەی لە بەر دەستی بەڕێزتاندایە لە سەر قورئانەکەی ئەزهەری پیرۆز ئەتوانێ کەلك وەرگرێ و تووشی هەلە نابێت ، بەلام جگە قورئانە چاپ کراوەکەی ئەزهەر هەرچی چاپ کراوی قورئانی تر هەیە بە گشتی هەلەیە هەر لە شێوە و دانانی و نووسینی ، واتە وێنە و شێوەی نووسینی نژوەکەی جیاوازە لە گەل چاپی ئەزهەری پیرۆز !.

ـ عەبدی ـ

# تابلۆی نۆزده (١٩)

سێ سورەت لە قورئانی پیرۆزدا یەکی (١٩) ئایەتن ، ئەو سورەتانەش سورەتی ( «علق» و «انفطار» و «اعلی» ) ن،وە لە ڕوانگەی ئەم یەکسانیەی ئایەتەکانیان گرتوومانن بە تابلۆ و ئەبێ پەیوەندیەکی پتەویان بە یەکەوە لە نێواندا هەبێ ، چونکە سێ سورەت لە قورئاندا بە بێ مەبەست و ویست هەر یەکەیان (١٩) ئایەت نابن ، جا با بزانین پەیوەندی هەیە لە نێوان ئەم سێ سورەتەدا ( «علق» و «انفطار» و «اعلی» ) کە لە ژمارەی ئایەتدا یەکسانن ٠٠٠؟!

١ ــ زەق ترین پەیوەندی‌یان پێکەوە هەبێ ئەوەیە هەر سێ سورەتەکە سەرجەمی ئایەتەکانیان = (٥٧) ئایەت ، کە ئەم ژمارەیە بێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی پیرۆز ــ (١٩) ــ ئەبێ (٥٧ ÷ ١٩ = ٣) .

وە هەر یەکەیان = (١٩) ئایەت ، کە هەر یەکەیان دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێ بێ مانەوەی هیچ کەرتێك (١٩ ÷ ١٩ = ١).

٢ ــ هەر دوو سورەتی «علق» و «اعلی» یەکسانن بە (٣٨) ئایەت ، هەر ئەم دوو سورەتە سەرجەمی ووشەکانیان یەکسانە بە (١٥٢) ووشە .

کەچی بەتەنهاش سورەتی «علق» ژمارەی ووشەکانی یەکسانە بە (٧٦) ووشە .

هەروەها سورەتی «اعلی»ش ژمـارەی ووشەکانی یـەکسانە بە (٧٦) ووشە ٠

سەرنج بدە ٠٠ ژمارەی ئایەتەکانیان بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبن (٣٨ ÷ ١٩ = ٢) ٠

هەروەها ئـەم دوو سورەتە ژمـارەی ووشەکانیان هـەر بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبن ٠

(١٥٢ ÷ ١٩ = ٨) ٠

کەچی بە جیاش ژمارەی ووشەکانیان بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبن ، ئەوەتا سەرجـەمی ووشەکانی سورەتی «علق» یەکسانە بە (٧٦) ووشـە (٧٦ ÷ ١٩ = ٤) ٠ هەروەهـا سەرجەمی ووشەکانی سورەتی «اعلی»ش هـەر یـەکسانە بە (٧٦) ووشـە (٧٦ ÷ ١٩ = ٤) ٠

٣ ـ ناوی «محمد» «صلی الله علیه وسلم» پێك هاتووە لە پیتی «م،ح،د»، ئەم سێ پیتـە پیرۆزترین پیتن لـە ناو هەموو پیتەکانی قورئانی پیرۆزدا ، چونکـە ناوی مەزنترین پێغەمبـەری لێ پێك هاتووە و تابلۆکەمان پتر لە نیوەی ، ئەم سێ پیتە پیرۆزە (م،ح،د) دیمەنی تابلۆکەن بۆ دلنیا بوونیش فەرموون سەرنجی دیمەنەکانی تابلۆکە بدەن ٠

لە ناو ئەم سێ پیتـە پیرۆزەدا کە پیتی «م،ح،د» ەپیتی «م» یەکەم پیتـە لـە پیرۆزیدا ، چونکـە پیتی «م» دوو جار لـە ناوی

«محمد»دا هـاتووه و ڕێژەی پیتی «م» = ڕێی ژمـارەی پیتی ناوی «محمد» ، هەروەها یەکەم پیتە لە ناوی «محمد»دا (واتە لە سەرەتای ناوەکە دایە) •

وە پیتی «ح٠د»یش بە دووەم پیت دائەنرێن لـە پیرۆزیدا ، چونکە ڕێژەی ئەم دوو پیتە یەکسانە بە ڕێژەی تەنها پیتی «م» لە ناوی «محمد»دا •

بەڵێ •••• لە هەر سێ سورەتەکەدا ئەم سێ پیتـە پیرۆزە (م،ح،د) ـکە پێك هێنەری ناوی «محمد»ە ، سەرجەمیان یـەکسانە بە (٩٥) «م،ح،د»، ئەم ژمارەیە بێ مانەوەی هیچ کـەرتێك دابـەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێ •

(٩٥ ÷ ١٩ = ٥)

وە پیتی پیرۆز لە نۆزدە ئایەتەکەی سورەتی «انفطار»دا سەر جەمیان یەکسانە بە (٣٨) «م،ح،د» کـە ئەم ژمارەیەش بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارەی پیرۆز ـ١٩ـ ئەبێ •

(٣٨ ÷ ١٩ = ٢)

هەروەها پیتی پیرۆز لە نۆزدە ئایەتەکەی سورەتی «علق»یشدا سەرجەمیان بێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمـارە (١٩) ئەبێ ، ئـەوەتا «م،ح،د» لـە نۆزدە ئایەتەکـەی ئـەم سورەتـەدا سەرجەمیان یەکسانە بە (١٩) «م،ح،د» •

(١٩ ÷ ١٩ = ١)

ئەبینین پیتی پیرۆز لە (٣٨) ئایەتەکەی سورەتی «انفطار» و سورەتی «علق»دا سەرجەمیان بێمانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێ ، کە ئەکاتە (٥٧) «م،ح،د» ·

(٣ = ١٩ ÷ ٥٧)

کەچی سەرجەمی پیتی ئەو ووشانەی پیتی پیرۆز (م،ح،د)یان تیایە لە هەمان (٣٨) ئایەتی هەر دوو سورەتدا سەرجەمی پیتەکانیان = (٢٠٩) ، ئەم ژمارەیەش بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارەی پیرۆز (١٩) ئەبێ ·

(١١ = ١٩ ÷ ٢٠٩)

(بۆ چەسپاندنی ئەم لقانەی سەرەوە و دلنیا بوون لێیان ، لە خشتەی ژمارە ـ١ـ کەلك وەرگرە) ·

سبحان الله ـ سەرنج بدە ئەم قورئانە پیرۆزە چەند بە شێوەیەکی بیرکاری و ئەندازەیی دانراوە ، هەر بە ئایەت و ووشە و پیت و «م،ح،د» و ناوی خوای مەزن و ناوی پێغەمبەران و ···· هتد گەورەترین بەلگەن بۆ ئەم ڕاستییە کە ئالۆزترین ئامێری سەدەی بیستەم بە ڕێژەی وردەکاری تاقە ئایەتێك لەگەل تابلۆکەیدا سادەترین ئامێرە ! ، ئێمە لە سەر بناغەیەکی بێ بەلگە ئامێری ژمێرکار ـ کۆمپیوتەر ـ ناکەین بە ڕەووڕەوەی گالیسکە نە چاو ئالۆزی و وردەکارییەکانی قورئانی پیرۆزەوە ·

فەرموون ئەوە ئێوە و تابلۆکانی قورئانی پیرۆز بزانن تابلۆکانی قورئان خاوەنی وردەکاری و دەست ڕەنگینی ترن یا بیر و هۆشی مرۆڤ ···!·

(١ـ٢ـ٣) ئەو ئایەتانەی ژمارەیان بۆ دانەنراوە ، بێ بەشن لە پیتی پیرۆز واتە «م،ح،د» یان، تیا نی‌یە •

لە هەر سێ سورەتەکەدا :

ئەو ئایەتانەی تەنها یەك پیت لە پیتی پیرۆزیان تیایە (واتە یەك «م»یا یەك «ح»یا یەك «د» ) ژمارەیان یەکسانە بە (٢١) ئایەت کەچی ئەو ئایەتانەی پتر لە پیتێ پیرۆزیان تیایە ژمارەیان لە هەمان سێ سورەتدا هەر یەکسانە بە (٢١) ئایەت (بڕوانە خشتەی ژمارە ـ١ـ) •

لە هەر سێ سورەتی «علق» و «انفطار» و «اعلی»دا :ـ

لە سورەتی «علق»دا ئەو ئایەتانەی تەنها پیتێ لە پیتی پیرۆزیان تیایە ژمارەیان = ٩ ئایەت •

لە سورەتی «انفطار»دا ئەو ئایەتانەی تەنها پیتێ لە پیتی پیرۆزیان تیایە ژمارەیان = ٧ ئایەت •

لە سورەتی «اعلی»دا ئەو ئایەتانەی تەنها پیتێ لە پیتی پیرۆزیان تیایە ژمارەیان = ٥ ئایەت •

ئەبینین ئەو ئایەتانەی تەنها پیتێ لە پیتەکانی ناوی«محمد»یان تیایە ، ژمارەی ئایەتەکانی «علق» بە دوو پلە پتر ترە لە ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی «انفطار»،وە ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی «انفطار»پتر ترە بە دوو پلە لە ژمارەی ئایەتەکانی سورتی «اعلی»•

(بڕوانە خشتەی ژمارە ـ٢ـ) •

**لە هەرسێ سورەتی «علق» و «انفطار» و «اعلى»دا ، لەم ئایەتانەی تەنها پیتێ لە پیتی پیرۆزیان تیایە :**

لە سورەتی «علق» پیتی ئەو ووشەیەی تەنها پیتەکەی ناوی «محمد»ی تیایە لە (٧) ئایەتیاندا پیتی ووشەکە ژمارەی پیتەکەی جووتە ٠

لە سورەتی «انفطار»دا لە سەر هەمان دەستور لە (٥) ئایەتیاندا پیتێ ووشەکە ژمارەی پیتەکەی جووتە ٠

لە سورەتی «اعلى»دا لە سەر هەمان دەستوری ناو براو لە (٣)ئایەتیاندا پیتی ووشەکە ژمارەی پیتەکەی جووتە ٠

ئەبینین لە سورەتی «علق» پیتی ئەو ووشەیەی تەنها پیتەکەی ناوی «محمد»ی تیایە لە (٧)ئایەتیاندا پیتی ووشەکە ژمارەی پیتەکەی جووتە ، وە لە سورەتی «انفطار»دا لە سەر هەمان دەستور لە (٥) ئایەتیاندا پیتی ووشەکە ژمارەی پیتەکەی جووتە،و لە سورەتی «اعلى»دا لە سەر هەمان دەستور لە (٣) ئایەتیاند پیتی ووشەکە ژمارەی پیتەکەی جووتە ، سەرنج بدە٠٠لە سورەتی «علق» بە دوو پلە لە سورەتی «انفطار» پتر ترە و سورەتی «انفطار» بە دوو پلە لە سورەتی «اعلى» پتر ترە ٠

ئەمە سەبارەت بە ژمارەی ئایەتەکانی ئەو ووشانەی کە تەنها پیتەکەیان (پیتیپیرۆز تیایە و ژمارەی پیتی ووشەکە جووتە ، و

بۆ ئایەتەکانی ئـەو ووشانـەی تە تەنهـا پیتەیەیان (پیتی پیرۆز) تیایە و ژمارەی پیتی ووشەکە تایە :ـ

لە سورەتی «علق» لەو ئایەتانەی تەنهـا پیتێ لـە پیتەیانی ناوی «محمد»یان تیایە پیتی ئەو ووشەیەی تەنهـا پیتەکـەی ناوی «محمد»ی تیایە ، لە (٢) ئایەتیاندا پیتی ووشەکە تاکە ٠

لە سورەتی «انفطار»یشدا لـە سەر هـەمان دەستور و گیراو لە (٢) ئایەتیاندا پیتی ووشەکە تاکە ٠

لە سورەتی «اعلى»ش لـە سەر هـەمان دەستوری ناو براو لە (٢) ئایەتیاندا پیتی ووشەکە تاکە ٠

(بڕوانە خشتەی ژمارە ـ٢ـ) :ـ

فەرموو سەرنج بدە و دەست ڕەنگینی و کارامـەیی خـوای مەزن لەم چەند لقانەی ڕابردوو (وداهاتوو)دا ببینە ٠

## خشتەی ژمارە ـ ٢ ـ

سورەتی «علق»

| نمرەی ئەو ئایەتانەی تەنها یەک بیتی بیرۆزیان تیایە | تەنها بیتە بیرۆزەکە | زمارەی بیتی ئەو ووشەیەی تەنها بیتەکەی ناوی «محمد»ی تیایە | زمارەی بیتی ئایەتەکە | زمارەی ووشەی ئایەتەکە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | م | ٤ | ١٨ | ٥ |
| ٢ | م | ٢ | ١٤ | ٤ |
| ٣ | م | ٦ | ١٤ | ١٣ |
| ١٠ | د | ٤ | ١٠ | ٣ |
| ١١ | د | ٥ | ١٨ | ٥ |
| ١٢ | م | ٢ | ١٢ | ٢ |
| ١٥ | م | ٢ | ٢٦ | ٦ |
| ١٨ | د | ٤ | ١٢ | ٢ |
| ١٩ | د | ٤ | ٢٠ | ٥ |

سورەتی «انفطار»

| نمرەی ئەو ئایەتانەی تەنها یەک بیتی بیرۆزیان تیایە | تەنها بیتە بیرۆزەکە | زمارەی بیتی ئەو ووشەیەی تەنها بیتەکەی ناوی «محمد»ی تیایە | زمارەی بیتی ئایەتەکە | زمارەی ووشەی ئایەتەکە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | م | ٦ | ١٥ | ٢ |
| ٢ | ح | ٦ | ١٤ | ٢ |
| ٧ | د | ٥ | ١٧ | ٤ |
| ٨ | م | ٢ | ١٧ | ٦ |
| ٩ | د | ٦ | ١٧ | ٤ |
| ١١ | م | ٥ | ١٠ | ٢ |
| ١٣ | م | ٤ | ١٦ | ٤ |

سورەتی «اعلى»

| نمرەی ئەو ئایەتانەی تەنها یەک بیتی بیرۆزیان تیایە | تەنها بیتە بیرۆزەکە | زمارەی بیتی ئەو ووشەیەی تەنها بیتەکەی ناوی «محمد»ی تیایە | زمارەی بیتی ئایەتەکە | زمارەی ووشەی ئایەتەکە |
|---|---|---|---|---|
| ٤ | م | ٦ | ١٥ | ٢ |
| ٥ | ح | ٤ | ١٣ | ٣ |
| ١٠ | م | ٢ | ١١ | ٣ |
| ١٥ | م | ٣ | ١٤ | ٤ |
| ١٨ | ح | ٥ | ١٩ | ٥ |

**له هەر سێ سورەتەکەدا ئەو ئایەتانەی تەنها یەك پیت لە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە :ـ**

لە سورەتی «علق» ئایەتی یەکەم ناوەڕاست و کۆتایی (کە ئایەتی «١» و «١١» و «١٩» هەمە ، هەر وەك لە خشتەی ژمارە ـ٢ـدا دەرئەکەوێ) ژمارەی ووشەکانیان = ١٥ ٠

لە سورەتی «انفطار» ئایەتی یەکەم و ناوەڕاست و کۆتایی ژمارەی ووشە کانیان = ١٣ ٠

لە سورەتی «اعلی» ئایەتی یەکەم و ناوەڕاست و کۆتایی ژمارەی ووشەکانیان = ١١ ٠

ئەبینین لە سورەتی «علق» ژمارەی ووشەکانی پتر ترە لە ژمارەی ووشەکانی سورەتی «انفطار» بە دوو پلە٠وە ژمارەی ووشەکانی سورەتی «انفطار» پتر ترە لە ژمارەی ووشەکانی سورەتی «اعلی» بە دوو پلە ٠

سەرنجی ئەوە بدە لەم چەند لقانەی ڕابردوو هەمیشە سورەتی «علق» بە دوو پلە لە سورەتی «انفطار» و سورەتی «انفطار» بە دوو پلە لە سورەتی «اعلی» پتر ترە ـ سبحان الله ٠

**لە هەر سێ سورەتەکەدا هەر لەو ئایەتانەی یەك پیت لە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە :**

سەرجەمی ئەو ووشانەی گەورەترین پیتیان ـ٢ـتیایە لە سورەتی «علق» ژمارەیان تاکە سەرجەمی ئەو ووشانەی دووەم

پیتیان( «ح» یا «د» )تیایە لە سورەتی «علق» ژمارەیان تاکە سەرجەمی ئەو ووشانەی گەورەترین پیتیان تیایە لە سورەتی «انفطار» ژمارەیان تاکە سەرجەمی ئەو ووشانـەی دووەم پیتیان تیـایە لـە سورەتی «انفطار» ژمارەیان تاکە سەرجەمی ئەو ووشانە گەورەترین پیتیان تیایە لە سورەتی «اعلی» ژمارەیان جووتە سەرجەمی ئەو ووشانەی دووەم پیتیان تیـایە لـە سورەتی «اعلی» ژمارەیان جووتـە (بڕوانە خشتەی ژمارە ـ٢ـ) ٠

چەندە پەیوەندییەکی ناسك و ڕازاوەیە ئەم لقەی ڕابردوو٠!
لە هەر سێ سورەتەکەدا هەر لەو ئایەتانەی تەنها پیتێ لە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە :ـ

سەرجەمی پیتی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیـان تیایە لـە سورەتی «علق» ژمارەی پیتەکانیان جووتە ٠

سەرجەمی پیتی ئـەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیـایە هەر لە سورەتی «علق» ژمارەی پیتەکانیان جووتە ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیـایە لـە سورەتی «انفطار» ژمارەی پیتەکانیان جووتە ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە هـەر لە سورەتی «انفطار» ژمارەی پیتەکانیان جووتە ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە لە سورەتی «اعلی» ژمارەی پیتە کانیان جووتە ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە هەر لە سورەتی «اعلی» ژمارەی پیتەکانیان جووتە ٠

(بڕوانە خشتەی ژمارە ـ٢ـ)

جێگای شیاوی خۆیەتی کە خوای مەزن ئەفەرمووێ **(والشفع و الوتر)** ـ واتە : سوێند بە جووت وتاك(١) « بنچینەو پێكهێنەری ژمارەکان » ـ سەرنجی ئەو لقانە بدە کە جووت وتاك تیایاندا سوڕ(دو د) ئەبینن ، ئەو سائەو ڕاستی‌یەت بۆ دەر ئەکەوێت کە خوای زانا لە بەر چی فەرموویەتی (و الشفع والوتر) ٠!

لە هەر سێ سورەتە کەدا هەر لەو ئایەتانەی تەنها پیتی لە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ووشانەی گەورەترین پیتیان تیایە لە سورەتی «علق» ژمارەی پیتەکانیان تاکە ،کەپیتەکا نیان = (١٧٠) ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ووشانەی دووەم پیتیان تیایە هەر لە سورەتی «علق»ژمارەی پیتەکانیان تاکە ،کە پیتەکانیان = (١٧) ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ووشانەی گەورەترین پیتیان تیایە لە سورەتی «انفطار»ژمارەی پیتەکانیان تاکە ،کە پیتەکانیان = (١٠٧) ٠

---

(١) دیاری‌ئاینده مصطفی علی برزنجی ٠ ص٣١ـ٣٢

سەرجەمی پیتی ئەو ووشانەی دووەم پیتیان تیایە هـەر لـە سورەتی «انفطار»ژمارەی پیتەکانیان تاکە ،کەپیتەکانیان = (١٧) ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ووشانـەی گەورەترین پیتیان تیـایە لە سورەتی «اعلیٰ» ژمارەی پیتەکانیان تاکە ٠

سەرجەمی پیتی ئەو ووشانەی دووەم پیتیان تیایە هـەر لە سورەتی «اعلیٰ»ژمارەی پیتەکانیان تاکە ٠
(بڕوانە خشتەی ژمارەـ٢ـ)

ناگونجێ بۆ هەموو لقێ دوای نووسینی ، لقەکە شی بکەینەوە و لە چۆنیەتی پەیوەندیەکانیان بووێین ٠ خوێرەری بـەڕێز ئـەبێ سەرنج و تێبیدی ئەوە بکات پەیوەندی ئەو لقەی لە خوێندنەوەیدایە لە نێوان سورەتێ یا فرەتردا چی‌یە ، ئەگـەر نا ئەوا ئەگـەر بۆ هەموو لقێ ئێمە بیدەینە بەر لێکۆلینەوە و چۆینـەتی پـەیوەندیان ئەبێ تەنها بۆ تابلۆیەکی وەك تابلۆی (١٩)ـواتە ئەم تابلۆیەی لـە خوێندنەوەیدایت ـ پتر لـە (٥٠٠)لاپەڕەی وەك لاپـەڕەکانی ئـەم کتێبەی لە بەر دەستت دایە ئەوێت ، وا بزانم ئەم کارەش ئەگەر بەو جۆرەبێ کە باسمان کرد لە چێژ پێزی تابلۆکە کەم ئەکاتەوە و سەرەڕای خۆ ماندوو کردنیش ٠

لە هەر سێ سورە تەکەدا لەو ئایەتانەی تەنها یەك پیت لـە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە :ـ

له سورەتی «علق» ژمارەی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیا یەـمـژمارەیان = ٥ ٠

له سورەتی «انفطار» ژمارەی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە ژمارەیان = ٤ ٠

له سورەتی «اعلى» ژمراەی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە ژمارەیان = ٣ ٠

کەچی بۆدووەم پیتیش له گەورەیی‌داـ«ح» یا «د» ـ له سەر دەستوری ناوبراو :

له سورەتی «علق» ژمارەی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە ژمارەیان = ٤ ٠

له سورەتی «انفطار» ژمارەی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە ژمارەیان = ٣ ٠

له سورەتی «اعلى» ژمارەی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە ژمارەیان = ٢ ٠

(بڕوانە خشتەی ژمارەـ٢ـ)

ئەبینین ئەو ئایەتانەی تەنها پیتەکەی ناوی «محمدیان» تیایە :
له سورەتی «علق» ئەو ئایەتانەی تەنها پیتەکەیان گەورەترین پیتە ژمارەیان پتر ترە له ژمـارەی ئایەتەکانی سـورەتی «انفطار» (ئەو ئایەتانەی تەنها پیتەکـەیان گەورەترین پیتە)بە یـەك پله ،

هەروەها ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی «انفطار» (ئەو ئایەتانەی تەنها پیتەکەیان گەورەترین پیتە) پتر ترە لە ژمارەی ئەو ئایەتانەی تەنها پیتەکەیان گەورەترین پیتە لە سورەتی «اعلی» بەیەك پلە ٠

ئەمە سەبارەت بە گەورەترین پیت ، هەروەها بۆ دووەم پیتش (ح٠د) بە هەمان شێوە و لە سەر هەمان دەستور :ــ

لە سورەتی «علق» ئەو ئایەتانەی تەنها پیتەکەیان دووەم پیتە ژمارەیان پتر ترە لە سەر هەمان گیراو لە ئایەتەکانی «انفطار» بە یەك پلە ، هەروەها ژمارەی ئایەتەکانی هەمان گیراو لە سورەتی «انفطار» پتر ترە لە ژمارەی ئایەتەکانی هەمان گیراو لە سورەتی «اعلی» بە یەك پلە ٠

سەرنج بدە چیمان دەستگیر بووە لە گرتنی ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە هەر بەو دەستورە لە گرتنی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە هەمان ٠

دەرچوومان دەستگیر بووە ، لە گەڵ ئەوەشدا سورەتی «علق» بەیەك پلە لە سورەتی «انفطار» و سورەتی «انفطار» بەیەك پلە لە سورەتی «اعلی» پتر ترە ، ئەمە سەبارەت بەو ئایەتانەی یەکەم پیت لەپیرۆزی (گەورەیی) دایان تیایە ، کەچی بۆ دووەم پیتیش لە

گەورەیی (پیرۆزی)دا بەهەمان شێوە سورەتی «علق» بەیەك پلە بە سورەتی «انفطار» بە یەك پلە لە سورەتی «اعلی» پترترە ٠

(بڕوانە خشتەی ژمارەی-٢-)

هەر لەو ئایەتانەی تەنها یەك پیت لە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە ئەبینین :-

لە سورەتی «علق»دا ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە ژمارەیان = ٥ ٠

هەر لە هەمان سورەت ئەو ئایەتانەی دووەم پیت لە گەورەیی‌یاندا تیایە ژمارەیان = ٤ ٠

لە سورەتی «انفطار»دا ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە ژمارەیان = ٤ ٠

هەر لە هەمان سورەت ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە ژمارەیان = ٣ ٠

لە سورەتی «اعلی»دا ئەو ئایەتانەی گەورەترین پیتیان تیایە ژمارەیان = ٣ ٠

هەر لە هەمان سورەت ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە ژمارەیان = ٢ ٠

ئەبینین ژمارەی ئەو ئایەتانەی «م»یان تیایە گەورەترە لە ژمارەی ئەو ئایەتانەی «ح» یا «د»یان تیایە بە یەك پلە لە هەر

کام لە سێ سورەتەکەدا ، هەر سورەتێکیان بگریت هەر یەك ئەنجامت ئەدا بە دەستەوە ، ئەوەتا :

لە سورەتی «علق»دا ژمارەی ئەو ئایەتانەی «م»یان تیایە پتر ترە لە ژمارەی ئەو ئایەتانەی «ح»یا«د»یان تیایە بە یەك پلە ٠

لە سورەتی «انفطار»یشدا هەر لە سەر هەمان دەستور ژمارەی ئەو ئایەتانەی «م»یان تیایە پتر ترە لە ژمارەی ئەو ئایەتانەی «ح»یا«د»یان تیایە بە یەك پلە ٠

لە سورەتی «اعلی»ش هەروا ژمارەی ئەو ئایەتانەی «م»یان تیایە پتر ترە لە ژمارەی ئەو ئایەتانەی «ح»یا«د»یان تیایە بە یەك پلە ٠

تێبینی ئەوە بکە سورەتی «علق لە سورەتی «انفطار» گەورەترە، وە سورەتی «انفطار» لە سورەتی «اعلی» گەورەترە ، بەڵگەشمان ئەوەیە ژمارەی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە لە سورەتی «علق» (لە سەر دەستوری ناو براو) یەکسانە بە ژمارەی ئەوئایەتانەی یەکەم پیتیانتیایە لەسورەتی «انفطار» لە سەر هەمان گیراو ٠

وە ژمارەی ئەو ئایەتانەی دووەم پیتیان تیایە لە سورەتی «انفطار» (لە سەر هەمان دەستوری ناو براو) یەکسانە بە ژمارەی ئەو ئایەتانەی یەکەم پیتیان تیایە لە سورەتی «اعلی» لە سەر هەمان گیراو ٠

ئەگـەر بەوردی سـەرنجی ئەوچـەند لقـە پڕ وردەکـاری وڕازاوانەی ڕابردوو بدەین ئـەبینین ژیری دەستە وەستانە لـە ئاستی چۆینەتی دانان وڕێکخستنیان ، بۆیە خوای زانا ئەفەرمووێ (ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کە ئەڵێن قورئان دانراوی «محمد»ە دەی تەنها سورەتێ وەك سورەتەکانی قورئان بهێننەوە) ٠

ڕاستە نەك هەر ناتوانن سورەتێ وەك سورەتەکانی قورئان بهێننەوە بەڵکو ناتوانن تەنهـا ئایـەتێ وەك ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بهێننەوە ٠ چونکە هەر ئایەتێ بگریت لە قورئاندا نەك هەر بە ووشە وپیت و«م، ح، ذ» و چەندەها لایەنی تر خاوەنی پەیوەندیەکی زۆر پتەوە بەڵکو بە زۆر لایەنی تر کە ژیری ئێمە ناتوانێ پـەی بەرێ بە نهێنیەکانی جگە بەشێکی کەم نەبێ ٠!

**لە هەر سێ سورەتەکەدا ئایەتی یەکەمیان :ـ**

لە سورەتی «انفطار»دا ژمارەی پیتەکەی تاکە

لە سورەتی «اعلی»دا ژمارەی پیتە کەی تاکە

لە سورەتی «علق»دا ژمارەی پیتەکەی جوتە کـەچی ئایەتی کۆتایی یان :ـ

لە سورەتی «انفطار»دا ژمارەی پیتەکەی تاکە

لە سورەتی «اعلی»دا ژمارەی پیتە کەی جووتە

لە سورەتی «علق»دا ژمارەی پیتەکەی جووتە

ئەبینین ژمارەی پیتی ئایەتی هەر سێ سورەتەکە پێچەوانەیی ئەنوێنن لە گەڵ ژمارەی پیتی ئایەتی کۆتایی‌یاندا ٠

ئەوەتا لە ئایەتی یەکەمیاندا دوو تاك بە جووتێك بە ژمارەی پیت دەر ئەکەن ، بەڵام لە ئایەتی کۆتایی‌یاندا دوو جووت بە تاکێك بە ژمارەی پیت دەرئە کەن ( بڕوانە خشتەی ژمارە ـ٣ـ ) کەچی نەك هەر بە ژمارەی پیت پێچەوانەیی ئەنوێنن ، بەڵکو بە پیتی پیرۆز (م،ح،د)تیایاندا هەر پێچەوانەیی ئەنوێنن ٠

ئەوەتا لە ئایەتی یەکەمی هەرسێ سورەتدا :ـ

لە سورەتی «انفطار»دا پیتی پیرۆز گەورەترین پیتە کە تیایەتی ـ واتە«م»ە ـ ٠

لە سورەتی «اعلی»دا پیتی پیرۆز گەورەترین پیتو دووەم پیتە کە تیایەتی ـ کە «م» و «ح»یە ـ ٠

لە سورەتی «علق»دا پیتی پیرۆز گەورەترین پیتە کە تیایەتی ـ کە «م»ە ـ ٠

وەلە ئایەتی کۆتایی‌یاندا :ـ

لە سورەتی «انفطار»دا پیتی پیرۆز گەورەترین پیتە کەتیایەتی

لە سورەتی «اعلی»دا پیتی پیرۆز گەورەترین پیت ودووەم پیتە کەتیایەتی ٠

له سورەتی «علق»دا پیتی پیرۆز دووەم پیتە، کە تیایەتی ـکە «د»ە ـ .

سەرنجی ئەم لقەبدە بزانەچەندە بە شێوەیەکی کارەبایی پیتی پیرۆز لە ئایەتی یەکەمیاندا پێچەوانەیی خۆیان دەر ئەبڕن لە گەڵ پیتی پیرۆز لە ئایەتی کۆتاییياندا ؟!

ئەبینین لە یەکەم ئایەتیاندا :ـ

ئایەتی یەکەمی دوو سورەتیان تەنها گەورەترین پیتیان تیایە وە لە ئایەتی کۆتاییياندا :ـ

ئایەتی کۆتایی یەك سورەتیان تەنها گەورەترین پیتی تیایە وە بۆ دووەم پیت لە گەورەییدا ئەبینین نە یەکەم ئایەتیاندا :ـ

ئایەتی یەکەمی یەك سورەیتان دووەم پیتی پیرۆزی تیایە وە لە ئایەتی کۆتاییياندا :ـ

ئایەتی کۆتایی دوو سورەتیان دووەم پیتی پیرۆزیان تیایە بۆ سەلماندنی ئەم پەیوەندییە پتەوە کە لە نێوان ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەتدا هەیە ، ئەم چەند بەیوەندییە پیرۆزە بەلگەن بۆیان :ـ

لە ئایەتی یەکەمی هەر سێ سورەتدا ژمارەی گەورەترین پیت لە پیرۆزیدا سێ ئەوەندی ژمارەی دووەم پیتە لە پیرۆزیدا ، واتەپیتی ( «م» = ٣ × «ح،د» ) .

کەچی لە ئایەتی کۆتایی هەمان سێ سورەتدا (دیسانەوە) ژمارەی گەورەترین پیت لە پیرۆزیدا سێ ئەوەندەی ژمارەی دووەم پیتە لە پیرۆزیدا ـ م = ٣ × «ح،د» ـ ٠

ئەوەتا لە ئایەتی یەکەمی هەر سێ سورەتدا ژمارەی گەورەترین پیت لە پیرۆزیدا سێ ئەوەندەی ژمراەی دووەم پیتە نە پیرۆزیدا ، کە پیتی پیرۆز لە ئایەتی یەکەمیاندا بەم شێوەیەیە (م،م،ح،م) سەرنج بدە پیتی «م» = ٣ × «ح،د» ـ واتە یەکەم پیت = ٣ × دووەم پیت ـ ٠

بەڵێ لە ئایەتی یەکەمیاندا (م = ٣) = [٣ × (ح،د = ١)]
هەروەها لە ئایەتی کۆتایی هەمان سێ سورەتدا پیتی پیرۆز بەم شێوەیەیە ( م،م،ح،م،د،م،م ) ، سەرنج بدە پیتی «م» = ٣ × (ح،د) ٠

ئەوەتا پیتی پیرۆز لە ئایەتی کۆتاییاندا (م = ٦) = [٣ × (ح،د = ٢)] ٠

بەڵێ خوێنەری بەرێز٠٠٠گەورەترین پیت لە پیرۆزیدا لە ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت یەکسانە بە سێ ئەوەندەی دووەم پیت لە پیرۆزیدا لە هەمان ئایەتەکانی هەر سێ سورەت ٠

ئەوەتا («م» = ٣(ح،د) ) لە ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت • «م» = (٩) ، «ح،د» = (٣) کەواتە

(«م» = ٣(ح،د) ــ [(م = ٩) = ٣ × (ح،د = ٣)] ــ •

نەك تەنها بە ژمارەی یەکەم پیتی پیرۆز لە ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت یەکسانە بەسێ ئەوەندەی دووەم پیتی پیرۆز لە هەمان ئایەتدا ، بەڵکو پیتی ئەو ووشانەی یەکـەم پیتی پیرۆزیان گرتۆتە خۆ لە ئایەتەکانی یەکـەم و کۆتایی هـەر سێ سورەت ژمارەی پیتەکانیان یەکسانن بە سێ ئەوەندەی پیتی ئـەو ووشانەی دووەم پیتیان گرتۆتە خۆ لە ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت بەڵێ پیتی ئەو ووشانەی یەکەم پیتی پیرۆزیان گرتۆتە خۆ لە ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت ژمارەی پیتەکانیـان =(٣٠)پیت ، وە پیتی ئـەو ووشانـەی دووەم پیتی پیرۆزیان گرتۆتـە خۆ لـە هـەمان ئایەتی هـەر سـێ سـورەت پیتەکانیان = (١٠)پیت •

ئەوەتا پیتەکانی ئەو ووشانەی یەکەم پیت لە پیرۆزیان تیایە یەکسانە بە سێ ئەوەندەی پیتەکانی ئـەو ووشانەی دووەم پیت لە گەورەیی (پیرۆزی‌یان تیـایە لـەو ئایەتانەی ناوبران ــ واتە (٣٠ = ٣ × ١٠) ــ •

نەك بە ژمارەی پیتی پیرۆز و ژمارەی پیتی ووشەی پیرا
گەورەترین پیت یەکسانن بە سێ ئەوەندەی دووەم پیت لە
گەورەیی‌دا بەلکو بە ژمارەی ووشەش هەر هەمان ئەنجامت ئەدە
بە دەستەوە ٠

ئەوەتا لە ئایەتەکانی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت ئا
ووشانەی یەکەم پیتی پیرۆزیان گرتۆتە خۆ ژمارەیان یەکسانە
سێ ئەوەندەی ژمارەی ئەو ووشانەی دووەم پیتی پیرۆزیان گرتۆ
خۆ لە هەمان ئایەتەکانی هەر سێ سورەتەکەدا ٠

ئەو ووشانەی یەکەم پیتی پیرۆزیان گرتۆتە خۆ لە ئایەت
یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت ژمارەیان = (٩)ووشە ٠
وە ئەو ووشانەی دووەم پیتی پیرۆزیان گرتۆتە خۆ لە
هەمان ئایەتی هەر سێ سورەت ژمارەیان = (٣)ووشە ٠

ئەوەتا [ووشەکانی یەکەم پیتی پیرۆز«٩» = (٣ × ووشەکان
دووەم پیتی پیرۆزە«٣»)] ٠

هەر لە هەمان سێ سورەتدا و هەر لە بارەی پەیوەند
نێوان ئایەتی یەکەمی هەر سێ سورەت لە گەل ئایەتی کۆتای
هەمان سێ سورەت ، لە ژمارەی ئەو ووشانەی پیتی پیرۆزیا
تیایە دەر ئەکەوێ ژمارەی ئەو ووشانەی پیتی پیرۆزیان تیایە
یەکەم ئایەتیاندا :-

له سوره‌تی «انفطار»ته‌نها یه‌ك ووشه پیتی پیرۆزی تیایه

له سوره‌تی «اعلی'»پتر له ووشه‌یه‌ك پیتی پیرۆزی تیایه

له سوره‌تی «علق»ته‌نها یه‌ك ووشه پیتی پیرۆزی تیایه

وه له ئایه‌تی كۆتایی‌یاندا :ـ

له سوره‌تی «انفطار»پتر له ووشه‌یه‌ك پیتی پیرۆزی تیایه

له سوره‌تی «اعلی'»پتر له ووشه‌یه‌ك پیتی پیرۆزی تیایه

له سوره‌تی «علق»ته‌نها یه‌ك ووشه پیتی پیرۆزی تیایه

به‌راوردی ئه‌وه بكه له هه‌ر سێ سوره‌تدا ئایه‌تی یه‌كه‌می دوو سوره‌تیان یه‌كی ته‌نها یه‌ك ووشه پیتی پیرۆزی تیایه ، وه سوره‌ته‌كه‌ی تریان پتر له ووشه‌یه‌ك پیتی پیرۆزی تیایه ٠ به‌لاّم له ئایه‌تی كۆتایی هه‌مان سێ سوره‌تدا به پێچه‌وانه‌وه ، ئایه‌تی كۆتایی دوو سوره‌تیان پتر له یه‌ك ووشه پیتی پیرۆزی تیایه ، وه سوره‌ته‌كه‌ی تریان ته‌نها یه‌ك ووشه پیتی پیرۆزی تیایه ٠

هه‌روه‌ها پێچه‌وانه‌یی ئایه‌ته‌كانی یه‌كه‌می هه‌ر سێ سوره‌ت به ناوی په‌روه‌ردگاریشه‌وه ئه‌نوێنن ـ هه‌ر وه‌ك پێچه‌وانه‌یی‌یان به ووشه‌ی پیرۆزه‌وه نواندبوو له لقی ڕابردوودا ـ له گه‌ل ئایه‌ته‌كانی كۆتایی هه‌ر سێ سوره‌ت ٠ ئه‌وه‌تا :ـ

له یه‌كه‌م ئایه‌تی هه‌ر سێ سوره‌تدا :ـ

له سوره‌تی«انفطار»دا ئایه‌تی یه‌كه‌می ناوی خوای تیانی‌یه

له سوره‌تی «اعلی» دا ئایه‌تی یه‌که‌می ناوی خوای تیایه
له سوره‌تی «علق» دا ئایه‌تی یه‌که‌می ناوی خوای تیایه
که‌چی له ئایه‌تی کۆتایی‌یاندا :ـ
له سوره‌تی «انفطار» دا ئایه‌تی کۆتایی ناوی خوای تیایه
له سوره‌تی «اعلی» دا ئایه‌تی کۆتایی ناوی خوای تیا نی‌یه
له سوره‌تی «علق» دا ئایه‌تی کۆتایی ناوی خوای تیا نی‌یه٠

ئه‌بینین له یه‌که‌م ئایه‌تی هه‌ر سێ سوره‌ت دوو ئایه‌تیان ناوی خوای تیایه، وه سوره‌ته‌که‌ی تریان ناوی خوای تیا نی‌یه، به پێچه‌وانه‌وه له ئایه‌تی کۆتایی‌یاندا دوو ئایه‌تیان ناوی خوای تیا نی‌یه، وه ئایه‌ته‌که‌ی تریان ناوی خوای تیایه ٠

تێبینی :ـ ناوه‌کانی خوا «**الله ـ الرحمن ـ الرحیم**» به‌لام «رب» یش هه‌ر به مه‌به‌ستی ناوی خوا ـ په‌روه‌ردگار ـ دێت ، خوا یاد بێت له لقه‌کانی داهاتوودا به شێوه‌یه‌کی فراوانتر ـ به‌به‌لگه‌وه ـ باسی ئه‌که‌ین و له سه‌ری ئه‌دوێین ٠

**له هه‌رسێ سوره‌ته‌که‌دا له‌و ئایه‌تانه‌ی بێ به‌شن له پیتی پیرۆز ـ واته «م، ح، د» یان تیا نی‌یه ـ** ، سه‌رجه‌می پیتی ئایه‌تی یه‌که‌می هه‌ر سێ سوره‌ت = (٤٤) پیت ٠

که‌چی له سه‌ر هه‌مان ده‌ستور سه‌رجه‌می پیتی ئایه‌تی کۆتایی هه‌مان سێ سوره‌ته = (٤٤) پیت ٠

خوێنەری بەڕێز..ئایا ئەبێ نرخی ڕێکەوت لەم لقانەدا چەند بێت ؟.ئەبینین ژمارەی پیتی ئەو ئایەتانەی کە بێ بەشن لە پیتی پیرۆز .

لە ئایەتی یەکەمی هەر سێ سورەت (واتە یەکەم ئایەتی هەر سێ سورەت کە بێ پیتی پیرۆزە)یەکسان بوون بە ژمارەی پیتی ئەو ئایەتانەی کە بێ بەشن لە پیتی پیرۆز لە ئایەتی کۆتایی هەر سێ سورەت (واتە دوا ئایەتی هەر سێ سورەت کە بێ پیتی پیرۆزە) .

ئەم هاوسەنگی یەی ڕابردوو سەبارەت بە ژمارەی پیتی ئەو ئایەتانە بوون کە بێ بەش بوون لە پیتی پیرۆز لە ئایەتی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت کە بێ پیتی پیرۆزن ، بەڵام ئایا ئەبێ بە ژمارەی ووشەش هەر پەیوەندی خۆیان بنوێنن لە هەمان سێ سورەت و لە هەمان ئایەتی یەکەم و کۆتایی هەر سێ سورەت کە بێ پیتی پیرۆزن .

بەڵێ ....بە ژمارەی پیت هاوسەنگیان دەر کردبوو بەڵام بە ژمارەی ووشە ژمارەی پیرۆز دەر ئەکەن،ئەوەتا سەرجەمی ووشەی ئەو ئایەتانەی بێ بەشن لە پیتی پیرۆز لە هەر سێ سورەتەکەدا لە یەکەم ئایەتیان و دوا ئایەتیان کە بێ پیتی پیرۆزن ژمارەیان یەکسانە بە (١٩) ووشە .

چەند تێبینی‌یەکی گرنگ :ـ

١) **ژمارەی پیرۆز** ئەو ژمارانەن کە بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە(**١٩**)ئەبن ،وە (**١٩**)شی بەر ئەکەوێت •

٢) **پیتی پیرۆز** مەبەست لە پیتی «م،ح،د»ە ، چونکە ئەم سێ پیتە پێك هێنەری ناوی «محمد ـ صلی الله علیه وسلم»ە •

٣) **ووشەی پیرۆز** ئەو ووشانەن کە پێتك یا پتر لە پیتەکانی ناوی «محمد»یان تیایە •

٤) **ناوی پیرۆز** مەبەست لە ناوی «**الله ـ الرحمن ـ الرحیم**»ە، چونکە ئەم سێ ناوە لەناوەکانی «اسم الاعظم»ن ، ئێمە کە ئەڵێین ئەم سێ ناوە لە ناوەکانی «اسم الاعظم»ن لە سەر چەند بەڵگەیەك وا ئەڵێین :ـ

أ ـ لە ئایەتی «**بسم الله الرحمن الرحیم**» ئەم سێ ناوە هاتووە ، هەر وەك ئەزانین «بسم الله الرحمن الرحیم» پەرژینە بۆ قورئانی پیرۆز •

ب ـ سەرجەمی ئەم سێ ناوە لە قورئانی پیرۆزدا یەکسانە بە (**٢٨١٢**) ئەم ژمارەیە بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارەی پیرۆز (**١٩**) ئەبێت(١)

(**١٤٨ = ١٩ ÷ ٢٨١٢**) •

سەرەڕای ئەوەی سەرجەمیان لە قورئاندا دابەشی سەر ژمارەی پیرۆز ئەبێ ، ئەم سێ ناوە هەر یەکەو بە تەنها سەرجەمیان

---

(١) (٢) (٣) (٤) نزیکترین دەرمانخانە/بکر غریب فرج •

دابەشی سەر ژمارەی پیرۆز ئەبێ بێ مانەوە ۰ ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا ناوی «**الله**» = (٢٦٩٨)، ئەم ژمارەیـە بێ مانەوە دابـەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت(٢) ۰

(٢٦٩٨ ÷ ١٩ = ١٤٢)

وە ناوی «**الرحمن**»یش لە قورئاندا = (٥٧) کە ئەم ژمارەیەش هەروەها بێ مانەوەدابەشی سەر ژمارە(١٩) ئەبێت(٣)

(٥٧ ÷ ١٩ = ٣) ۰

وە ناوی«**الرحیم**»یش لـە قورئاندا = (٥٧) ئـەم ژمارەیـەش هەروەها بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە(١٩) ئەبێت(٤)

(٥٧ ÷ ١٩ = ٣) ۰

ج ـ تێبینی ئەوە بکە لە زۆربەی زۆری تابلۆکاندا ـ کـە هێشتا رێگای چاپیان ئەگرتۆتە بەر ـ ئەبینین ئـەم سـێ نـاوە خاوەنی هاوبەشی کردنێکی گەورەیە لە دروست بوون و پێك هاتنی تابلۆبدا ، بۆ نموونە لە تابلۆیەکدا ئەڵێن :ـ

ناوی پیرۆز لەم تابلۆیەدا = (١١٤) (١١٤ ÷ ١٩ = ٦) یا = ٧٦ ، ٩٥یا ۰۰۰۰ هتد ، وە لە سەر چەند بەڵگەیەکی تر ئەتوانین بەوپەڕی دڵنیایی و بێ گومانی‌وە بڵێین ئـەم سێ ناوە ـ **الله** ـ **الرحمن** ـ **الرحیم** ـ لە ناوەکانی «ناوی مەزنی خوا»ن ۰

وە بۆ سەلماندنی پیتی «م،ح،د» کە «قورئان ئەفەرمووێ» ئەم سێ پیتە لە هـەموو پیتەکانی تر پیرۆزترن ، فەرموون سـەیری تابلۆکە بکـەن و بزانن هەموو سورەت و ئایـەت و ووشەکانی

---

قورئان گەواهی لە سەر پیرۆزی ئەم سێ پیتە ئادەن کە پێك هێنەری ناوی «محمد»ە «صلی الله علیه وسلم» ٠

**لە هەرسێ سورەتەکەدا لەو ئایەتانەی بە زنجیرە «واتە دوا بە دوای یەکتر ـ توالي ـ» پیتی پیرۆزیان تیایە :ـ**

لە سەر ئەم دەستورە ئەبینین لە سورەتی «علق» لە ئایەتی یەکەمەوە تا ئایەتی پێنجەم بە زنجیرە پیتی پیرۆزیان تیایە، وە لە ئایەتی پێنجەم بەولاوە ئەم زنجیرەیە ئەپچڕێ ، کەواتە لە ئایەتی پێنجەم بەولاوە ناڕۆین لە گرتنی پەیوەندیەکەدا ٠

هەر لە سەر هەمان دەستور لە سورەتی «انفطار» و سورەتی «اعلی» :ـ

لە سورەتی «انفطار» لە یەکەم ئایەتی بەولاوە زنجیرەی پیتی پیرۆز ئەپچڕێ ٠

هەروەها لە سورەتی «اعلی»ش لە یەکەم ئایەتی بەولاوە زنجیرەی پیتی پیرۆز ئەپچڕێ ، پەیوەندیەکە لێرەدا دەست پێ دەکات :ـ

لە سورەتی «علق» و سورەتی «انفطار»دا ئەو ووشانەی پیتی پیرۆزیان تیایە لە سەر ئەو دەستورەی باسمان کرد پیتەکانیان = (٣٨) ئەم ژمارەیە بێ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت (٣٨ ÷ ١٩ = ٢) ٠

کەچی لە سورەتی «علق» و «اعلى»ش لە سەر هەمان دەستور ئەو ووشانەی پیتی پیرۆزیان تیایە پیتەکانیان = (٣٨) بۆ مانەوە دابەشی سەر (١٩) ئەبێت ·

(٣٨ ÷ ١٩ = ٢) ·

ئەبینین سورەتی «علق» لە گەل سورەتی «اعلى»و سورەتی «انفطار» (٣٨) بە (٣٨) دەر ئەکەن ، ئایا ئەبێ سورەتی «علق» بە تەنها چی دەر کات ؟

سەرنج بدە سورەتی «علق» لە گەل هەر دوو سورەتەکەدا بەشداری ئەکات لە دەر کردنی ژمارە (٣٨) دا ، وەگەورەترین سورەتەکە زنجیرەی پیتی پیرۆزی ئەوەندە درێژ بێت لەم تابلۆیەدا، وەپیتەکانی ئەم پێنج ئایەتەی کە زنجیرەکەیان پێك هێناوە لە سورەتی «علق» پیتەکانیان = (٧٦) ئەم ژمارەیەش بۆ مانەوە دابەشی سەر ژمارە (١٩) ئەبێت ·

(٧٦ ÷ ١٩ = ٤)

(بڕوانە خشتەی ژمارە ـ٣ـ)

## خشتەی ژمارە ـ٣ـ

| زنجیرەی ئایەتەکان | ژمارەی پیتی ئایەتەکانی «علق» | ژمارەی پیتی ئایەتەکانی «انفطار» | ژمارەی پیتی ئایەتەکانی «اعلی» |
|---|---|---|---|
| ١ | ١٨ | ١٥ | ١٥ |
| ٢ | ١٤ | ١٧ | ١١ |
| ٣ | ١٤ | ١٤ | ١٢ |
| ٤ | ١٣ | ١٥ | ١٥ |
| ٥ | ١٧ | ١٨ | ١٣ |
| ٦ | ١٦ | ٢٦ | ١٣ |
| ٧ | ١١ | ١٧ | ٣١ |
| ٨ | ١٤ | ١٧ | ١٢ |
| ٩ | ١٣ | ١٧ | ١٦ |
| ١٠ | ١٠ | ١٤ | ١١ |
| ١١ | ١٨ | ١٠ | ١٤ |
| ١٢ | ١٢ | ١٤ | ١٩ |
| ١٣ | ١٥ | ١٦ | ١٩ |
| ١٤ | ١٧ | ١٦ | ١٢ |
| ١٥ | ٢٦ | ١٥ | ١٤ |
| ١٦ | ١٤ | ١٦ | ٢١ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧ | ١٠ | ١٧ | ١٥ |
| ١٨ | ١٢ | ١٨ | ١٩ |
| ١٩ | ٢٠ | ٣٣ | ١٤ |

قورئان هەر بە سورەت و ئایـەت و ووشە و پیتەکانیەوە لـە سەر یاسا و دەستورێکی یەکجـار ورد و ناوازە دانراوە ، ئەگـەر ئێمە بێتو بە چاوێکی سەرنجەوە لە ژمارەی سورەتەکانی قورئان و ژمارەی ئەوئایەتانەی گرتوویانەتە خۆ ورد بینەوە ئەبینین :

ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لـە نێوان (١ـ٥٠) یـە ژمارەیان = (٦٦) سورەت ٠

ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لـە نێوان (٥٠ـ١٠٠) ژمراەیان = (٣٠)سورەت ٠

ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لە نێوان (١٠٠ـ١٥٠) یە ژمارەیان = (١١)سورەت ٠

ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لـە نێوان (١٥٠ـ٢٠٠) ژمارەیان = (٤)سورەت ٠

ئەو سورە تانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لەنێوان ٢٠٠ـ٢٥٠ یە ژمارەیان = ٢ سورەت ٠

ئەو سورەتانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لـە نێوان (٢٥٠ ـ پتر) ژمارەیان = (١)سورەت ٠

یان بە شێوەیەکی تر هەر وەك لەم خشتەیەدا دەر ئەکەوێ(١):

| ژمارەی سورەت | ژمارەی ئایەتەکانیان |
|---|---|
| ٦٦ | ١ــ٥٠ |
| ٣٠ | ٥٠ــ١٠٠ |
| ١١ | ١٠٠ــ١٥٠ |
| ٤ | ١٥٠ــ٢٠٠ |
| ٢ | ٢٠٠ــ٢٥٠ |
| ١ | ٢٥٠ــپتر |

سەرجەمیان = ١١٤ = بە سورەتەکانی قورئان ٠

سەرنج بدە ژمارەی سورەتەکان و ڕێژەی ئایەتەکانیان چەند ناسك و پاراوە بە وردەکاری، بڕوانە :

ژمارەی سورەتەکانی قورئان = (١١٤) =

← (٦٦) ← یەکسانە بە دوو هێندە(پتر)ی(٣٠)

← (٣٠) ← یەکسانە بە دوو هێندە(پتر)ی(١١)

← (١١) ← یەکسانە بە دوو هێندە(پتر)ی(٤)

← (٤) ← یەکسانە بە دوو هێندەی(٢)

← (٢) ← یەکسانە بە دوو هێندەی(١)

← (١)

(١) ئەم خشتەیەم لە کتێبی (العلوم الطبيعية في القرآن) يوسف مروە وەر گرت ٠

ئەو ئایەتانەی پتر لــە پیتێکیان لــە پیتەکانی ناوی«محمد»یان تیایە بە هەرجێ، ئەو پیتانە یەك پیت بن کە دووبارە بوونەتەوە،واتە پیتەکان یا «م»بن یا «ح»بن یا «د»بن ٠

ئەم خشتەیە ئەو ئایەتانەی گرتۆتە خۆ کە لــە دەستوری ناو براودا (سەرێدا) ناومان بردون ٠

## خشتەی ژمارە ـ٤ـ

| سورەت | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ |
|---|---|---|---|---|---|
| سورەتی «انفطار» | ژمارەی پیتی ئەو وشانەی پیتی پیرۆزیان تیایە لە ئایەتەکەدا | ٨ | ٨ | ٤ | ١٧ |
| | ژمارەی پیتی پیرۆز لە ئایەتەکەدا | ٢ | ٢ | ٢ | ٤ |
| | ژمارەی ووشەی ئایەتەکە | ٧ | ٣ | ٤ | ٩ |
| | ژمارەی پیتی ئایەتەکە | ٢٦ | ١٤ | ١٦ | ٣٣ |
| | نمرەی ئایەتەکان لە سورەتەکانیاندا | ٦ | ١٢ | ١٦ | ١٩ |
| سورەتی «اعلى» | ژمارەی پیتی ئەو وشانەی پیتی پیرۆزیان تیایە لە ئایەتەکەدا | ٧ | ٨ | | |
| | ژمارەی پیتی پیرۆز لە ئایەتەکەدا | ٢ | ٣ | | |
| | ژمارەی ووشەی ئایەتەکە | ٣ | ٩ | | |
| | ژمارەی پیتی ئایەتەکە | ١٢ | ٣١ | | |
| | نمرەی ئایەتەکان لە سورەتەکانیاندا | ٣ | ٧ | | |
| سورەتی «علق» | ژمارەی پیتی ئەو وشانەی پیتی پیرۆزیان تیایە لە ئایەتەکەدا | ٩ | ١١ | ٧ | ١٠ |
| | ژمارەی پیتی پیرۆز لە ئایەتەکەدا | ٢ | ٤ | ٢ | ٢ |
| | ژمارەی ووشەی ئایەتەکە | ٣ | ٥ | ٥ | ٢ |
| | ژمارەی پیتی ئایەتەکە | ١٣ | ١٧ | ١٧ | ١٠ |
| | نمرەی ئایەتەکان لە سورەتەکانیاندا | ٤ | ٥ | ١٤ | ١٧ |

له سەر ئەو دەستورەی باسمان کرد ئەبینین :

له سورەتی«علق»یەکەم ئایەتی (کە بەر دەستورەکە ئەکەوێت) ژمارەی پیتەکەی تاکە ٠

له سورەتی«انفطار»یەکەم ئایەتی (کە بەر دەستورەکە ئەکەوێت) ژمارەی پیتەکەی جووتە ٠

له سورەتی «اعلی» یەکەم ئایەتی (کە بەر دەستورەکە ئەکەوێت) ژمارەی پیتەکەی جووتە ٠

کەچی بۆ ئایەتی کۆتایی‌یان(کە بەر دەستورەکە ئەکەوێت‌واتە نەك ئایەتی کۆتایی سورەتەکە بەڵکو ئایەتی کۆتایی دەستورەکە) :

له سورەتی«علق»ئایەتی کۆتایی ژمارەی پیتەکەی جووتە ٠

له سورەتی«انفطار»ئایەتی کۆتایی ژمارەی پیتەکەی تاکە ٠

له سورەتی«اعلی»ئایەتی کۆتایی ژمارەی پیتەکەی تاکە ٠

فەرموو سەرنج بدە چەند بە شێوەیەکی ڕازاوە پێچەوانەیی ئەنوێنن بە ژمارەی پیتەکانیان له ئایەتی یەکەمیان له گەڵ ئایەتی کۆتایی‌یاندا تەنانەت ئایەتی یەکەم له گەڵ ئایەتی کۆتایی هەر سورەتێکیان ئەگری پێچەوانەیی خۆیان ئەنوێنن،ئەوەتا :

له سورەتی«علق»یەکەم ئایەتی ژمارەی پیتەکەی تاکە

ئایەتی کۆتایی‌یەکەی ژمارەی پیتەکەی جووتە

